هەر کەس کە بیەوێت و (شایستە بێت) و خوا فراوانگیرو زانایە (بەنهێنی و ئاشکرا، بەشایستەیی و ناشایستەیی هەر کەس و هەر لایەنێک . بەڕاستی تەنها خۆشەویست و پشتیوانی ئێوە، هەر خواو پێغەمبەرەکەی و ئەوانەن باوەڕیان هێناوە، کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەردەکەن و هەمیشە دیاردەی کڕنوش و ملکەچییان بۆ پەروەردگار پێوە دیارە.جا ئەوەی خواو پێغەمبەرو ئەوانەی بڕوایان هێناوە بەپشتیوان و خۆشەویستی خۆی قەبوڵ بکات، ئەوە با دڵنیا بێت کە هەر کۆمەڵ و دەستەو تاقمی خوا، زاڵ و سەرکەوتوون )

ئەم ئایەتانە هاتووە دەربارەی خۆشویستنی گاور و جولەکە ، کە ئاماژە بە هەڵگەڕانەوەی ئەو کەسە ئەکات کە خۆشەویستی بۆ جولەکەو گاور هەبێت و سەریان بخات لە چەند ڕویەکەوە :-

**ڕوی یەکەم /** فەرمایشتی الله تعالی﴿ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ﴾شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە ئەفەرمێت " هیچ کۆمەڵ و گرۆیەک نییە لە ئیسلام هەڵبگەڕێنەوە ئیلا الله تعالی کەسانێک دێنێت کە خۆشیانی ئەوێت ئەوانش الله تعالی یان خۆش ئەوێت وە جیهاد ئەکەن لە پێناویدا کە ئەوانیش کۆمەڵی ڕزگاربوون تاوەکو هەڵسانی قیامەت ، لەدرێژەی ئەم باسەدا دیارە کە باسی خۆشویستنی کافران و سەرخستنیانی کردووە هەروەک چۆن الله تعالی فەرمویەتی﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ..... ﴾ تا ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ ﴾المائدة ٥١ - ٥٤ ئەوانەی قسەیان بۆ کراوە لە قەدەغەی خۆشەویستی و سەرخستنی گاور و جولەکە ئەوانەن کە ئاماژەیان بۆ کراوە بە ئایەتی هەڵگەڕانەوە ( الرِدّة ) ، وە ئاشکراشە کە ئەمە هەموو سەردەمەکان ئەگرێتەوە ..... (الفتاوى)

**ڕوی دووەم /** تاک تێگەیشتن لە فەرمایشتی خوای پەروەردگار ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ ﴾المائدة ٥٥ کە خۆشەویستی و پشتیوانی تایبەت کردووە بە الله تعالی و پێغەمبەرو موسوڵمانان وە جگە لەو خۆشەویستی و سەرخستنە ئەوانەی تر هەمووی لەدەرەوەی فەرمانی شەریعەتدایە .

**ڕوی سێ یەم /** فەرمایشتی الله تعالی﴿ وَمَن يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ ﴾المائدة ٥٦ جێگەو مایەی تێگەیشتن لەم ئایەتەدا ئەوەیە هەرکەسێک خۆشەویستی و سەرخستنی بۆ کافران هەبوو ئەوا لە کۆمەڵ و دەستەی شەیتانە ﴿أُولَٰئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ ۚ أَلَا إِنَّ

حِزْبَ الشَّيْطَانِ ۚهُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ المجادلة ١٩ واتا (ئائەوانە دەستە و تاقم و حزبی شەیتانن، ئاگاداربن کە بێگومان دەستە و تاقم و حزبی شەیتان خەسارەتمەند و زەرەرمەندن. )

**ڕوی چوارەم /** فەرمایشتی الله تعالی﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاءَ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ المائدة ٥٧ واتا( ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: نەکەن ئەوانە بکەنە پشتیوان و جێگەی متمانەی خۆتان کە گاڵتەو گەمەیان بە ئاینەکەتان کردووە، چ لە خاوەنانی کتێبی پێش خۆتان، چ لە بێ باوەڕان، لە خواش بترسن و پارێزکاربن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن. ) ئەم ئایەتە لە چوار چێوەی ئایەتەکانی پێشوتر، کە پاڵپشتی ئەکات لەوەی هەرکەسێک خۆشەویستی و سەرخستنی بۆ کافران هەبێت ئە وا لە دین هەڵگەڕاوەتەوە ، شێخ عبداللطیف کوڕی عبدالرحمن آل شێخ فەرمویەتی " بیربکەرەوە لە فەرمایشتی الله تعالی کە ئەفەرمێت ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ئەوا ئەو پیتە –ئەوەش ( إن ) شەرتییەیە – کۆتای هێنان بە بەرپەرچدانەوەی مەرجەکانی دەکات ئەگەر وەڵامەکەی بەرپەرچدرایەوە " واتای ئەوەیە " هەرکەسێك ئەوان بکاتە پێشەنگی خۆی ئەوا موسوڵمان نییە " ( الدرر السنية في الأجوبة النجدية )

٥ :- فەرمایشتی الله تعالی ﴿ لَّا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَن تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ۗ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ﴾آل عمران ٢٨ واتا ( نابێت ئیمانداران، کافران بکەنە پشت و پەناو یارو یاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، ئەوەی کاری وا بکات، ئەوکارەی دەبێتە هۆی ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی ئیمانی بەخواوە نەمێنێت، مەگەر لەبەر ئەوەی خۆتان بە بێگومان لە شەڕیان بپارێزن و قوتاربن (ئەویش بەوەی بەدەم ڕازییان بکەن، نەک بەدڵ و کردەوە)، الله تعالیبێدارتان دەکاتەوە بەسیفەتی تۆڵەسەندنەوەی خۆی دەتانترسێنێت (تا کاری نارەوای وانەکەن)، سەرئەنجام و گەڕانەوەتان هەر بۆ لای خوایە)

ئیبن جەریری طبری ئەفەرمیت "واتای ئەوەیە ئەی موسوڵمان نەکەن کافران بکەنە  پاڵپشت و پشتیوان و خۆشەویست و سەرخەری خۆتان لەسەر دینەکەیان ، وە سەریان بخەن بەسەر موسوڵمانان ، وە عەیبوعاری موسوڵمانانیان پێبڵێبن ، هەرکەسێک ئەوکارە بکات ئەوا هیچ پەیوەندییەکی ئیمانی بە الله تعالی وە نامێنێت ، واتا لە الله تعالی بەرییە وە الله تعالی ش لەوبەرییە بە هەڵگەڕانەوە لە ئاینەکەی و چونە ناو کوفرەوە ، مەگەر لەبەر ئەوەی خۆتان لە شەڕیان بپارێزن :

ئەمەش کاتێک ئەبێت دەبێت لەژێر دەسەڵاتی ئەوان بێت و لێیان بترسێت لەبەر نەفسی خۆتان ، بەزمان هاوڕا بیت لەگەڵیان وە بە کردەوەو بە دڵیش دوژمنایەتیان بۆ دەربڕی ، وە نابێت شوێنیان بکەون لەوەی ئەوان لەسەرین لە بێ باوەڕی ، وە نابێت سەریان بخەیت بەسەر موسوڵمانان بە کردەوە ".

٦ :- فەرمایشتی الله تعالى﴿ بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ۞ الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾النساء١٣٨ - ١٣٩ واتا (ئەی پێغەمبەر ﷺ مژدە بە دووڕووەکان بدە کە بەڕاستی سزایەکی بەئێشیان بۆ ئامادە کراوە!!، ئەو دووڕووانەی کە بێ باوەڕەکان دەکەنە پشتیوان و یارویاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، ئایا دەیانەوێت عیزەت و دەسەڵات و سەربەرزیان لای ئەوان دەست بکەوێت؟ (ئەوانە بەهەڵەدا چوون) چونکە بەڕاستی عیزەت و باڵادەستی و سەربەرزیی هەر هەمووی بۆ خوایە)

ئیبن جەریری طبری ئەفەرمیت " الله تعالى بە پێغەمبەرەکەی ئەفەرمێت: ئەی محمد ﷺ " مژدە بە مونافیقەکان بدە " ئەوانەی کە بێباوەڕن بەمن و بێدینان ئەکەن بەسەر مەشق و پێشەوای خۆیان ؛ واتا : سەر خەرو براگەورەی خۆتان جگە لە موسوڵمانان ؛ واتا : موسوڵمانان:-ئایا دەیانەوێت عیزەت و دەسەڵات و سەربەرزیان لای ئەوان دەست بکەوێت؟ و ئەفەرمێت : ئایە جگە لە وانەی باوەڕیان بەمن هێناوە ئەوان ئەکەنە سەرگەورەو پشتیوانی خۆتان تاوەکو بتان پارێزن و هێزو دەسەڵاتتان پێببەخشن ؟ (ئەوانە بەهەڵەدا چوون) چونکە بەڕاستی عیزەت و باڵادەستی و سەربەرزیی هەر هەمووی بۆ الله تعالى یە) ئەفەرمێت : ئەوانەی کە کافرانیان کردووە سەرگەورە و پشتیوانی خۆیان بەنیازی شکۆ و سەربەرزین بەڵام ئەوانە سەرشۆڕو سوکن ، دەی ئەی بۆ موسوڵمانانیان نەکردە سەرخەرو سەرگەورەی خۆیان ئەوا ئەو کاتە سەر بەرزو بەهێز ئەبوون و سەر کەوتنتان بۆ ئەهاتە لە لای الله تعالى وە کە ئەوش خۆی خاوەن شکۆ و دەسەڵاتە ، ئەو خوایەی ویستی لێبێت هەرکەسێک سەربخات سەری ئەخات وە ویستی لێبێت هەرکەسێک سەرشۆڕو زەلیل بکات ئەیکای " .

٧ :- الله تعالى ئەفەرمێت﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴾الحشر ١١ واتا ( ئایا سەرنجت نەداوە لەوانەی کە دووڕوو بوون و بەبرا بێباوەڕەکانیان لە خاوەن

کتێب دەڵێن: ئەگەر ئێوە دەربکرێن ئێمەش لەگەڵتاندا دەردەچین، هەرگیز دژی ئێوە بەقسەی کەس ناکەین، خۆ ئەگەر جەنگتان دژ بکرێت ئێمە پشتیوانیتان لێ دەکەین، بەمەرجێک؛ خوا خۆی شایەتە کە ئەوانە بێگومان درۆزنن )

شێخ سولەیمانی کوڕی عبدالله ئەفەرمێت " ئەگەر هەرکەسێک پەیمان بدات بە هاوبەشدانەرەکان بە نهێنی بە چونە ژورەوە لەگەڵیان و سەرخستنیان و دەرچون لەگەڵیان کاتێك دەرئەکرێن بە دووڕوی و کوفر بژمێردرێت ئەگەر بە درۆشبێت ، ئەی دەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە بە ئاشکرا و بە ڕاست گۆیانە پەیمانیان پێبدات ؟؟ !! .

٨ :- الله تعالى ئەفەرمێت ﴿ لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ، كَانُوا لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ، تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ ,وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴾ المائدة ٧٨– ٨١

واتا (نەفرین کراوە لەوانەی: بێ باوەڕ بوون لە نەوەی ئیسرائیل لەسەر زاری داودو عیسای کوڕی مەریەم، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ئەوان یاخی و سەرکەش بوون و دەستدرێژیان دەکرد.

ئەوانە قەدەغەی یەکتریان نەدەکرد لە خراپەو تاوانێک کە دەیانکرد، سوێند بێت بەخوا ئەوەی کە دەیکەن زۆر خراپ و ناپەسەندە!

زۆربەیان دەبینیت ڕازین بەخۆشەویستی و پشتیوانی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، سوێند بە خوا دەست پێشکەرییەکی خراپیان بۆ خۆیان ئەنجامداوە کە خوایان لە خۆیان توورە کردووە (بەو کارەیان)، (لە قیامەتیشدا) لەناو سزای دۆزەخدا دەبێت بۆ هەمیشە بمێننەوە.

خۆ ئەگەر ئەوانە باوەڕیان بەخواو بەم پێغەمبەرەو ئەو قورئانە ببوایە کە بۆی دابەزیوە، ئەوە ئەوانەیان نەدەکرد بەخۆشەویست و سەرپەرشتیاری خۆیان، پشتیان بەوان نەدەبەست، بەڵام زۆربەیان تاوانبارو لادەرو یاخین و (حەق و ڕاستی مەبەستیان نیە، بەڵکو بەردەوام دژایەتی ئاینی ئیسلام دەکەن)

کە ئاماژە ئەکات بە بەکافر بوونی ئەوکەسەی کە خۆشەویستن و سەرخستنی بۆ کافران هەبێت لە دوو ڕووەوە :

**ڕوی یەکەم /**الله تعالى دەربارەیان ئەفەرمێت ﴿ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ ﴾ کە ئەمەش نیشانەو باسکردنی سزای کافرانە ، شێخ سولەیمانی کوڕی عبدالله ئەفەرمێت " الله تعالى تورەی خۆی و مانەوە بە هەمیشەی لەناو ئاگری دۆزەخ پێویست و واجب کردووە لەسەر ئەو کەسانەی کە کافرانیان خۆش ئەوێت و سەریان ئەخەن بەسەر موسوڵمانان دا ، ئەوەش تەنها بە خۆشویستنیان و سەرخستنیان ئەگەر لە ترساش بێت ، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە بەزۆر پێی ئەکەن کە ئەوەش مەرجی خۆی هەیە " .

**ڕوی دووەم /**الله تعالى فەرمویەتی ﴿ وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴾ شێخی ئیسلام ئەفەرمێت " باسی ڕستەی مەرجی کردووە و بڕاندییەتێوە کە ئەگەر مەرج هەبوو ئەوا مەرج لەسەرش دەبێت بە پیتی ئەگەر ( لو) بە نەمانی مەرج ئەو کاتە مەرج لەسەر کراویش نامێنێت ، کە فەرمویەتی ﴿ وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ ﴾ ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەو بیروبڕوایەی کەباسکراوە نایان کاتە خۆشەویست و سەرخەری خۆیان بەڵکو لە دژی ئەوەستێتەوە ، باوەڕهێنان بە الله تعالى و خۆشویستن و سەرخەستنی کافران لە دڵێکدا کۆ نابێتەوە " ( الفتاوى )

وە شێخ سولەیمانی کوڕی عبدالله فەرمویەتی " الله تعالى باسی ( موالاة ) ی کافرانی کردووە کە ڕەتکردنەوەی ئیمانە الله تعالى وپێغەمبەر ﷺ و ئەوەی بۆی دابەزیوەتە خوارەوە ، پاشان الله تعالى فەرمویەتی هۆیەکەی ئەوەیە زۆربەیان فاسقن ، وە جیاوازی نەکردووە لەنێوان ئەو کەسی کە لە ترسا ئەو کارەی کردووە لەگەڵ ئەو کەسەی بەبێ ترس کارەکەی کردووە ، کە ئەوەش حاڵی زۆربەی هەڵگەڕاوەکانن پێش ئەوەی هەڵبگەڕێنەوە لە ئیسلام ، وە زۆرینەیان فاسقن ، کە ئەوەش وای کردووە کە کافران سەر بخات بەسەر ئیسلام دا ، پەنا ئەگرین بە الله تعالى لەو کارە

٩ :- الله تعالى ئەفەرمێت ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴾ الأنفال ٧٣ واتا (ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون، هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن و پشتیوانی لە یەکتر دەکەن، خۆ ئەگەر ئێوەی ئیماندار کۆمەک بەیەکتر نەکەن و پشتی یەکتر نەگرن ئەوە لەسەر زەویدا ناخۆشی و ناکۆکی و گوناهو تاوانی گەورە پێش دێت (ئازار و ناخۆشی بۆ ئێوەی ئیماندار پێش دێت).

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر کافر بونی ئەوکەسانەی کە سەرخەری کافرانن لە دوو ڕووەوە :

**ڕووی یەکەم** :الله تعالى ئەفەرمێت ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾الأنفال ٧٣ واتا ( ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون، هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن و پشتیوانی لە یەکتر دەکەن) هەرکەسێک موالاتیان بکات (سەرخستن و خۆشەویستی ) ئەوا ئەو ئایەتە ئەیگرێتەوە ﴿ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ﴾

**ڕووی دووەم** : ﴿ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴾ الأنفال ٧٣ واتا (خۆ ئەگەر ئێوەی ئیماندار کۆمەکی‌یەکتر نەکەن و پشتی یەکتر نەگرن ئەوە لەسەر زەویدا ناخۆشی و ناکۆکی و گوناهو تاوانی گەورە پێش دێت (ئازار و ناخۆشی بۆ ئێوەی ئیماندار پێش دێت ) وشەی ( الفتنة ) لە قورئان دا بە چەند واتایەک دێێت لەوانە ش :

شرک و کوفر الله تعالى ئەفەرمێت﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ ﴾ البقرة ١٩٣ واتا (خۆ ئەگەر کافران کۆڵیان نەداو هەر جەنگان و پیلانیان گێڕا) ئێوەش بجەنگن دژیان تا وەکو هاوەڵگەری و ئاشوب و ناخۆشی نەمێنێت، هەروەها تا دین و ئاین و بەرنامەو فەرمانڕەوایی هەر بۆ الله تعالى ئەبێت ) وەهەروەها لە ئایەتێکی تردا الله تعالى ئەفەرمێت ﴿ فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾النور ٦٣ واتا (دەبا ئەوانەی کە سەرپێچی لە فەرمانی دەکەن بترسن لەوەی کە تووشی تاقی کردنەوەیەکی سەخت، یان تووشی سزایەکی بە ئێش ببن )

إبن كثير ئەفەرمێت : واتای ئەم ئایەتە ﴿ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴾ واتا : ئەگەر لە موشریکەکان دورنەکەونەوە و دۆستایەتی ئیمانداران نەکەن فیتنە و ئاژاوە ئەکەوێتە نێوان خەڵکی ، خەڵکی سەری لێ تێک ئەچێت و ئیمانداران و کافران تێکەڵ دەبن ئەوکات فەسادێکی زۆر ئەکەوێتە نێوان مرۆڤەکان .

وە شێخ عبداللطيف کوڕی عبدالرحمن کوری حسن آل الشيخ ئەفەرمێت ( ئەوەی لەقورئاندا هاتووە لە ڕێگری و توندییەکی زۆر لە دۆستایەتییان و موالاتیان کە بنچینەی بنچیناکان : کە بەبێ ئەوە دامەزراو نابێت کە ئەوەش بریتییە لە پچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ دوژمنانی الله تعالى و جەنگ وجیهادیان لەگەڵدا بکات و خۆی بێبەری بکات لێیان ، وە لە الله تعالى نزیک ببێتەوە بە ڕق لێ بونەوەیان و عەیبدارکردنیان : الله تعالى گرێبەستی کردە نێوان ئیماندارن وفەرمووی کافران بۆ خۆیان دۆستی یەکترن هەروەک ئەفەرمێت

﴿ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴾ باشە فیتنە هەر شرک نییە و فەساد بریتی نییە لە لەناوچونی توحيد و ئیسلام و برین و لە ناچونی حوکمەکانی ئیسلام ؟ " [ الدرر ] .

١٠ :- الله  تعالی ئەفەرمێت ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تُطِيعُوا الَّذِينَ كَفَرُوا يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَاسِرِينَ ، بَلِ اللَّهُ مَوْلَاكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ النَّاصِرِينَ ﴾ آل عمران ١٤٩-١٥٠   وتا (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ملکەچ و گوێڕایەڵی ئەوانە بن کە کافر و بێ دینن، ئەوە بەرەودوا دەتانگێڕنەوە و پاشگەزتان دەکەنەوە و لە دین وەرتاندەگێڕن، ئەوسا ئیتر بە دۆڕاوی دەگەڕێنەوە , (دڵنیابن کە خوانەناسان یارو یاوەری ئێوە نین) بەڵکو خوا یارو یاوەرتانە، بێگومان ئەو زاتە چاکترین پشتیوان و یاریدەدەرتانە. )

شێخ سلێمانی کوڕی عبدالله آل شێخ ئەفەرمێت  :  الله  تعالی هەواڵی داوە ئەگەر ئیمانداران بەقسەی کافران بکەن ئەوا بێگومان لە ئاینی ئیسلام هەڵیان دەگێڕنەوە ، ئەوان لێیان ڕازی نابن ئیلا بەکافر بوون نەبێت وە هەواڵی دواە ئەگەر ئەو کارە بکەن ئەوا خەسارەت مەندی دونیاو قیامەت ئەبن ، وە ڕێشی نەداوە ڕازیبن و بەقسەیان بکەن لە ترسا ، وە هەر واشە ئەوان ڕازی نابن لە کەسێك تاوەکو شایەدی نەدات بۆ ئەوان کە لەسەر حەقن وە دژایەتی خۆی بۆ موسوڵمانان ئاشکرا بکات و لێیان دوربکەوێتەوە  " [ الدرر ]

١١ :- الله  تعالی ئەفەرمێت ﴿ الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا ﴾ النساء ٧٦     واتا (ئەوانەی ئیمانداران (تەنها) لە پێناوی خوادا دەجەنگن (بەڵام) ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی ستەمکارو زۆردار و (تاغوت)دا دەجەنگن، دە بجەنگن دژی یاوەرانی شەیتان (چونکە) بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پووچ و لاوازە. )

الله  تعالی ڕونی کردۆتەوە ئەوانەی بێباوەڕن لەپێناو طاغوت جەنگ دەکەن وە ئەوان دۆستی شەیتانن وە هەرکەسێک لەڕیزی ئەوان جەنگ بکات وەکو ئەوان وایە و لەڕیزی ئەوانە ، ئایەتەکە بەڵگەیە کەهەرکەسێک یارمەتی کافران بدات لە جەنگیان دژی موسڵمانان بەهەر جۆرێک بێت ئەوا ئەو کەسە هاوەڵ ودۆستی شەیتانە .

( ئیتر بە  چەک بێت یان بە پارە بێت یان بە نەفسی خۆی بێت یان دوعاکردن بێت یان بە دڵ بێت .....)

١٢ :- الله  تعالی ئەفەرمێت ﴿ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ ﴾ الأعراف ١٧٥  واتا ( ئەی محمد ﷺ هەواڵی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەرەوە کە

فەرمانەکانی خوامان پێبەخشی بوو، کەچی ئەویش خۆی لێ داماڵی و خۆی لێ دووره پەرێز گرت، ئەوسا ئیتر شەیتان شوێنی کەوت و دایەپێش و چووە ڕیزی سەر لێشێواوانەوە. )

إبن جرير بەسەنەدی خۆی لە عبدالله ی کوڕی عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کەفەرمویوتی "کاتێک پێغەمبەر موسی عليه السلام خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون گەیشتنە لای جبارین "''' بلعام بن باعورا'''' کوڕە مام و قەومەکەی هاتن بۆ لای بلعام و وتیان بەڕاستی موسی پیاوێکی زۆر توند و بەزەبرە و سوپایەکی زۆری لەگەڵە ئەگەر سەرکەوێت بەسەرماندا لەناومان ئەبات ، دوعامان بۆ بکە الله موسی و سوپاکەی بگەڕێنێتەوە ، بلعام وتی: ئەگەر دوعا بکەم الله موسی و جەماعەتەکەی بگەڕێنێتەوە دونیاو دوارۆژم لە دەست ئەچێت ، قەومەکەی بەردەوام داوایان لێی ئەکرد دوعایان بۆ بکات تاوەکو دوعای لێیان کرد ، پاشان الله تعالى ئەو ئیمان و باوەڕەی کە لە دڵیدا جێگیر ببوو دایماڵاند هەروەکو چۆن الله تعالى ئەفەرمێت ﴿ فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ ﴾

ئەو لێرەدا تەنها بەدوعا کردن کافرانی سەرخست لەرێگەی الله تعالى لایدا ئە ی ئەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە لەوە زیاتر پشتگیری کافران بکات ؟

١٣ :- الله تعالى ئەفەرمێت ﴿ أَفَحَسِبَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن يَتَّخِذُوا عِبَادِي مِن دُونِي أَوْلِيَاءَ ۚ إِنَّا أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ نُزُلًا ﴾ الكهف ١٠٢ واتا ( ئایا ئەوانەی کافرو بێ باوەڕ بوون وا دەزانن کە هەروا بۆیان دەچێتە سەرو چاوپۆشییان لێ دەکەین لە کاتێکدا کە ئەوان بەندەکانی ئێمە دەکەنە یارو یاوەری خۆیان و پشت بەوان دەبەستن و ئێمە فەرامۆش دەکەن، ئەوانە بابزانن کە بەڕاستی ئێمە دۆزەخمان ئامادەکردووە بۆ بێ باوەڕان کەلەوێ دادەبەزن و نیشتەجێ دەبن.)

الله تعالى ڕونی کردۆتەوە کە بەندە چاکەکانی هەرگیز دۆستایە تی کافران ناکەن وە هەرکەسێک وابکات ئەوا الله تعالى ئە یخاتە دۆزەخەوە بەسەر شۆڕی و بە زەلیلی .

## باسی دووەم :

## بەڵگەکان لە فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ

١:- فەرمودەی یەکەم (ما روه الشيخان في حديث علي ﷺ في حديث غزوة الفتح – قال : " بعثني رسول الله ﷺ أنا والزبير والمقداد، فقال : << انطلقوا حتى تأتوا روضة خاخ ؛ فإن بها ظعينة معها كتاب فخذوه منها>> فانطلقنا تعادى بنا خيلنا حتى اتينا الروضة ، فإذا نحن بالظعينة ، قلنا : "أخرجي الكتاب"، قالت : " ما معي من كتاب "، قلنا لتخرجن الكتاب أو لتلقين الثياب "، فأخرجت من عقاصها ، فأخذنا الكتاب فأتينا به رسول الله ﷺ فإذا فيه : " من حاطب بن أبي بلتعة إلى أناس من المشركين بمكة يخبرهم ببعض أمر رسول الله ﷺ " ، فقال رسول الله ﷺ : <<يا حاطب ، ما هذا ؟ >>قال: لا تعجل علي، إني كنت امرأ ملصقا في قريش، ولم أكن من أنفسهم ، وكان من معك من المهاجرين لهم قرابات يحمون أهليهم بمكة ، فأحببت إذ فاتني ذلك من النسب فيهم أن أتخذ فيهم يدا يحمون بها قرابتي وما فعلت ذلك كفرا ولا ارتدادا عن ديني ولا رضا بالكفر بعد الإسلام " ، فقال رسول الله ﷺ: << إنه صدقكم >> فقال عمر:" دعني أضرب عنق هذا المنافق ": وفي رواية : " فقد كفر "، فقال رسول الله ﷺ : <<إنه قد شهد بدرا ، وما يدريك لعل الله اطلع إلى أهل بدر فقال : اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم >> .

واتا : دوو شێخەکە ( بوخاری و موسلیم ) دەگێڕنەوە لە علی ﷺ لەفەرمودەی غەزوەی فەتحی مەککەدا وتی : رسول الله ﷺ من و زوبێر و مقدادی نارد فەرموی : { بڕۆن تاوەکو دەگەنە روضة خاخ (ناوی شوێنێکە ) ئافرەتێکی لێیە نوسراوێکی پێیە لێی بسێنن } ڕۆتشتین بە خێرای تاوەکو گەیشتینە روضة ، ئافرەتەکەمان بینی و وتمان نوسراوەکە دەرکە ، وتی " هیچ نوسراوێکم پێ نییە ، وتمان یان نوسراوەکە دەردەکەیت یان جلەکەت دادەکەنی ، پاشان نوسراوەکەی لە ناو پەرچەمی دەرکرد و هێنامانەوە بۆ رسول الله ﷺ ، تیایدا نوسرابوو : لە حاطبی کوڕی بەلتەعەوە بۆ کەسانێک لە موشریکەکانی مەککە ، هەواڵیان ئەداتێ بەهەندێک لە فەرمانەکانی رسول الله ﷺ ، رسول الله ﷺ فەرموی : حاطب ئەمە چییە ؟ ، وتی : پەلەم لێ مەکە من کەسێک بووم لەقورەیشییەکان نزیک بووم بەڵام لەوان نەبووم وە ئەو کۆچبەرانەی لەگەڵ تۆن خزم و کەس و کاریان هەیە لە مەککە تا ماڵ و منداڵیان بپارێزن بەڵام من خزمم نییە لەناویان وا ویستم بەم کارە

شتێک بکەم خزم و کەسم بپارێزن ، وە مەبەستم لەم کارە ئەوە نەبووە کافربم یان پاشگەزبمەوە لەدین وە ڕازیش نەبوومە بە کوفر پاش ئیسلام ، رسول الله ﷺ فەرمووی : ئەو ڕاستی کرد لەگەڵتان ، ئیمامی عومەر وتی : وازم لێ بێنە با لەملی ئەم دووڕووە بدەم ، لەڕیوایەتێکی تردا " ئەم کافرە " ، رسول الله ﷺ فەرمووی ئەم بەژداری جەنگی بەدری کردووە ، تۆ چوزانی ڕەنگە الله تعالی تەماشای ئەهلی بەدری کردبێت فەررمویەتی : چ کارێک دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بووم .

ئەم چیرۆکە بەڵگەیە کەلە بنچینەدا سەرخستنی کافران و هاوکاری کردنیان هەڵگەڕانەوە و دەرچونە لە ئیسلام لەسێ ڕووەوە :-

- ❖وتەکەی ئیمامی عومەر { وازم لێبێنە با بدەم لەملی ئەم دووڕووە ، وە لە ڕیوایەتێکی تردا : ئەم کافرە ، وە لە ڕیوایەتێکی تردا : پاش ئەوەی رسول الله ﷺ فەرمووی :ئەی ئەو بەژداری جەنگی بەدری نەکردووە ؟ ئیمامی عومەر وتی بەڵام هەڵگەڕاوەتەوە لەدین دوژمنەکانتی بەسەرتدا سەرخست } ئەمە بەڵگەیە کە لای ئیمامی عومەر ڕون و ئاشکرایە کە سەرخستنی کافران هەڵگەڕانەوە و دەرچونە لە ئیسلام .
- ❖ حاطب وتی { مەبەستم لەم کارە کوفر نەبووە یان پاشگەزبوونەوە لەدین و ڕازیبونیش نییە بە کوفر پاش ئیسلام بوون } وە ئەمەش بەڵگەیە کە ئەوش ئەیزانی کوفر و هەڵگەڕانەوە و دەرچونە لە ئیسلام ڕازی بوونە بەکوفر ، باشە ئەگەر بۆ ئەو کارە گومانی وا ببردرێ بە حاطب ﷺ کە کردی کە لە کاتێکدا لەگەڵ رسول الله ﷺ دەرچووە بۆ غەزا و بە گیان و ماڵی خۆی پشتگری کردووە و سەری دەخستووە بەسر دوژمنەکانی لە موشریکەکان ، وە کافرانی سەر نەخستووە بە بەماڵی و نەبە گیانی ، لە کاتێکدا کارەکەی نزیکبووە لەکوفرەوە ئاوهای پێ وترا !!!! ئەی چی ئەڵێیت بۆ کەسانێک کافران سەر بخات بە کردەوەو هاوکارییان بکات دژی مسڵمانان ؟؟ بێگومان ئەو لەپێشترە بەو حوکمانەی کەباسکراوە لەم فەرمودەیە .

٢:- فەرنودەی دووەم { ما رواه ابن إسحاق وغيره عن يزيد بن رمان عن عروة عن الزهري عن جماعة سماهم قالوا : بعثتْ لنا قريش إلى رسول الله ﷺ في فداء أسراهم ، ففدى كل قوم أسيرهم بما رضوا ، وقال العباس – وكان خرج مكرهاً مع المشركين في بدر : يا رسول الله ؛ قد كنت مسلماً ، فقال رسول الله ﷺ << الله أعلم بإسلامك ، فإن يكن كما تقول فإن الله يجزيك، وأما ظاهرك فقد كان علينا ، ففتدِ نفسك وابنَي أخيك >>.

واتا ( لەڕیوایەتی ابن اسحاق و جگە لەویش لە زیدی کوڕی رمان وە ئەویش لە عوروەو ئەویش لە زوهرییەوە ئەوش لە کۆمەڵێکەوە ناویانی وتووە ئەڵێن : قورەیش کۆمەڵێکی نارد بۆ لای رسول الله ﷺ بۆ ڕزگارکردنی دیلەکان ، هەموو هۆزێک دیلەکانیان ڕزگارکرد بەوەی ڕازی بوون ، عباس وتی {کە موشریکەکان بەزۆر هێنابویان بۆ بەدر } : ئەی رسول الله من موسڵمان بووم ، رسول الله ﷺ فەرمووی الله زانایە بەموسڵمانبونت ، ئەگەر ئەوەی ئەیڵێت وابێت الله پاداشتت ئەداتەوە بەڵام لە ڕوکەش تۆ دژی ئێمەبوی ، خۆت و دوو کوڕە براکەت ڕزگاربکە )

هەرچەندە عباس ی کوڕی عبدالمطلب بەزۆر بردرابو لەگەڵ قورەیش بەڵام رسول الله ﷺ حوکمی ڕوکەشی دا بەسەریا و کردییە پاڵ موشریکەکان ، ئەی ئەبێت حاڵی کەسێک چۆن بێت کە بە ویستی خۆی پشتیوان و هاوکاری کافران بکات ؟؟

بەڵگەیەکی تر لەسەر ئەمە لە صحیحی بوخاری هاتووە لە محمدی کوڕی عبدالرحمن أبو الاسود وتی : سوپا حازرکرا بۆ سەر مەدینە منش ناوی خۆم نوسی لەو سوپایە ، پاشان گەیشتم بەعکرمە کۆیلەی ابن عباس و بۆیم باسکرد ، زۆر بەتوندی ڕێگر لێمکرد لەو کارەو و وتی : ابن عباس هەواڵی داپێم کە کۆمەڵێک لەموسڵمانان لەگەڵ موشریکەکان بوون و ڕەشایی ئەوانیان زیاد کردبوو لەسەردەمی رسول الله ﷺ ، تیر ئەهات و یەکێکیانی ئەکوشت یان لەملی دەدرا و دەکوژرا االله تعالی ئایەتی داگرت و فەرموی ﴿ إِنَّالَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ ﴾النساء ٩٧ واتا (بەڕاستی ئەوانەی لە سەرە مەرگدا فریشتە گیانیان دەکێشن لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە ستەمیان لە خۆیان دەکرد (ئیمان و باوەڕیان لە مەترسیدا بوو کەچی کۆچیان نەدەکرد بۆ نیشتمانی ئیمان، بەتوندیی پیایاندا هەڵدەشاخێن ) بڕوانە چۆن ئەوان پاڵدرانە پاڵ ئەوان لە ڕوکەش دا هەرچەندە بەزۆر هێندرابون ، ئەوە تەنها لەبەر ئەوەی بنچینەی کارەکە کوفرە .

٣:- فەرمودەی سێ یەم ( ما رواە ابو داودوغیرە عن سمرة بن جندب ﷺ أن النبي ﷺ قال :<<من جامع المشرك وسكن معه فهو مثله >>.

واتا : گێردراوەتەوە لە ابو داودەوە وە جگەلەوەش لە سمرة کوڕی جوندبەوە ﷺ ئەویش لە رسول الله ﷺ فەرمویەتی :" هەرکەسێک لەگەڵ کەسانی موشریک کۆ ببێتەوە و نیشتەجێ بێت لەگەڵیان ئەوە وەکو ئەوان وایە " ) .

❖بۆیە ئەو کەسەی کۆدەبێتەوەو تێکەڵی موشریک ئەبێت وەک ئەوی لێ کرد ، لەبەر ئەوەی ڕۆیشتن بۆ لای دوژمنی الله تعالی و دۆستایەتییان وا دەکات پشت لە الله تعالی بکەی ، وە هەر کەسێک پشت لەو بکات ئەوا شەیتان دۆستایەتی ئەکات و کافری ئەکات .

❖زەمەخشەری ئەڵێت : ئەمە شتێکی ڕوونە :" دۆستایەتی خۆشەویست و دۆستایەتی دوژمن دژی یەکترن " . [ فیض القدير للمناوی ]

❖شەوکانی ئەڵێت :" { فهومثله } وەک ئەوە بەڵگەیە کە حەرامە نیشتەجێ بیت لەگەڵ کافران ، واجبە لێیان جودابیتەوە ، ئەگەر چی فەرمودەکەی پێشوتر قسەی لەسەرە بەڵام بەڵگەی دروستی ئەم ئایەتەیە ﴿فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ﴾ النساء ١٤٠ واتا (ئەوە دامەنیشن لەگەڵ ئەوانەدا هەتا قسەو باسەکەیان بەگۆڕن (ئەگەر دابنیشن و گوێ نەدەنێ) ئەوە بەڕاستی ئێوەش لەو کاتەدا وەک ئەوانن و (حسابی ئەوانتان بۆ دەکرێت ) وە فەرمودەی ( بهز بن حكيم بن معاوية بن حيدة ) وە جگە لەوش لا جەریری کوڕی عبدالله ﷺ ئەویش لە رسول الله ﷺ کە فەرمویەتی { لا يقبل الله من مشرك عملا بعدما اسلم او يفارق المشركين } . واتا ( الله یەک کردەوە لەموشریک وەرناگرێت پاش موسڵمان بوون یان دەبێت لوموشریکەکان جیاببێتەوە ) [ نيل الاوطار] .وەکو ئەم فەرمودەیەش :

٤:-فەرمودەی چوارەم ( ما رواه أبو داوي و الترمذي و غيرها عن جرير بن عبدالله ﷺ أن الرسول ﷺ قال: << أنا بريء من كل مسلم يقيم بين ظهراني المشركين >> .

واتا { من بەریم لەهەمو موسڵمانێک نیشتەجێیە لە نێوان موشریکەکان }

لە م فەرمودەیەدا هەمان شت ئەوترێت کە لەفەرمودەکەی پێشوتر وترا .

٥:- فەرمودەی پێنجەم (ما رواه النسائي وغيره من حديث بهز بن حكيم عن أبه عن جده أن النبي ﷺ قال { لا يقبل الله من مشرك عملا بعدما اسلم او يفارق المشركين}.

ئەم فەرمودەیەش هەر وەکو ئەوانەی تر هەرکەسێک پشت گیری و هاوکاری کافران دەکات و دژایەتی موسڵمانان دەکات لە پێشترە ئەم فەرمودەیە بیگرێتەوە لەکەسێک بەلاشەی لێیان جیانەبێتەوە .

٦:- فەرمودەی شەشەم ( ما رواه النسائي وغيره عن جريرﷺ قال : بايعت رسول الله ﷺ : "على إقام الصلاة وإيتاء الزكاة والنصح لكل مسلم ، وعلى فراق المشرك " .

واتا ( نەسائی و جگە لەوش ریوایەتیان کردووە لە جەریرﷺ وتی : پەیمانم دا بە رسول الله ﷺ لەسەر نوێژ کردن و زەکات دان و ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێک ، وە جیابونەوە لە موشریک ) .

قسە کردن لەسەری هەروەکو فەرمودەکانی پێشوتر وایە .

## باسی سێ یەم

## بەڵگەکان لە کۆدەنگی زانایان :

کەس وا نەزانێت ئەم باسە ئیجتیهادەو زانایان ڕاجیاییان هەیە تاوەکو ئیجماع بێننەوە نا بەڵکو ئەومەت هەمووی کۆدەنگن لەسەرئەوەی هەرکەسێک دۆستایەتی و هاوکاری کافران بکات دژی موسڵمانان ئەوە کافر و هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام ، دامەزراوی ئەم کۆدەنگییە لە دوو ڕوو دایە :

**یەکەم** : باسکردنی وتەی زانایان هەرچەندە مەزهەبیان جیابێت لەسەر ئەم بابەتە ، کەلە کۆتای ئەم بەشە باس کراوە ، کەقسەی زانایانمان هێناوەتەوە لە مەزهەبەکانی { حەنەفی – مالیکی – شافیعی – حەنبەلی – ظاهري } وە موجتەهیدانی جگە لەوانیش وە زیاتر لەوەش قسەو فەتوای زانایانی ئەم دواییە { المتأخرين }

**دووەم** : باسی ئەو زانایانەی ئیجماعیان باس کردووە لەسەر ئەم بابەتە :

❖ زانای پایە بەرز ابن حزم ئەڵێت : " ڕاست ئەوەیە لەم ئایەتە ﴿ مَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ المائدة ٥١ واتا ( ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) هەر وەکو ڕوکەش خۆی { ظاهر } کە ئەو کەسە کافەر وەکو کافران ، وە ئەمە ڕاستییەکە کە دوو موسڵمان جیاوازییان تیایدا نییە " . [ المحن ]

❖ وتەی شێخ عبداللطيف بن عبدالرحمن بن حسن آل شێخ ؛ پاش ئەو قسەیەی کە وتی واجبە دژایەتی کافران بکەیت تەبەرایان لێ بکەیت ، وتی ( ئەی کەسێک حوکمی دەبێت چۆن بێت کە یارمەتییان بدات و ڕایان بکێشێت بۆ وڵاتی موسڵمانان ، یان بەشان و باڵیانا هەڵبدات یان ئەوان بە دادپەروەرتر بزانێت لەخەڵکی موسڵمانان وە وڵاتی ئەوانی هەڵبژارد بۆ نیشتەجێبوون و دۆستایەتی ئەوانی کرد و حەزی کرد ئەوان سەربکەون ، کە ئەمەش هەڵگەڕانەوەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بەبێ جیاوازی } "[ الدرر]

❖ وتەی شێخ عبدالله ی کوڕی حمید : تولی بریتییە لە :" ڕێزگرتنیان و مەتح کردنیان و سەرخستنیان و هاوکارکردنیان دژی موسڵمانان و تێکەڵبونیان و خۆبەرینەکردن لێیان بە ئاشکرا ، ئەمە پاشگەزبونەوەیە بۆ خاوەنەکەی وە دەبێت حوکمی هەڵگەڕاوە برسەریدا جێ بەجی بکرێت هەروەک چۆن بەبەڵگە باسکراوە لە قوریان و فەرمودەو کۆدەنگی پێشەوایانی ئوممەت ". ( الدرر)

**باسی چوارەم :**

**بەڵگەکان لە وتەی هاوەڵە بەڕێزەکان ﵃ :**

١:- ئەو باسەی کە تێپەڕی دەربارەی ئیمامی عومەر وحاطب ﵄

٢:- ڕیوایەتی إبن حمید لە حذیف وەوە ﵁ کە فەرمووی : لیتق احدکم ان یکون یهودیا او نصرانیا وهو لا یشعر ! فظننا‌ه یرید هذه الآیة ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ﴾ المائدة ٥١

واتا :" خۆتان بپارێزن لوەی ببنە جولەکە یان گاور لەکاتێکدا کە هەستی پێ ناکەن ! وا گومانمان برد مەبەستی ئەم ئایەتەیە : واتا (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت )

٣:- وە هەر لەو بابەتە بەسەرهاتی خالدی کوڕی وەلید ﵁ لەگەڵ مجاعەی کوڕی مرارة لە کتێبەکانی سیره لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان ، کاتێک خالید ﵁ بەشێک لە سەربازەکانی بەنی حەنیفەیان دەستگیرد کە ( مجاعة ) شیان تێدابوو ، مجاعة بە خالیدی وت : واللە من نەکەوتومەتە دوای ( مەبەستی موسەیلەمەی درۆزن ) بوو من موسڵمانم ، خالید وتی : ئەی بۆ نەهاتیت بۆ لای من یان وەکو ( ثمامة بن اثال ) قسەت بکردایە " .

مانەوەی ناو مورتەدانی کردە بەڵگە لەسەری کە ئەویش ڕازییە بەوان ، بۆیە وەک ئەوان مامەڵەی لەگەڵی کرد ، ئەمەش وەکو ئەو بەڵگانەی پێشوترە کە لە قورئان دەرهەق بەو موسڵمانانەی کە لەگەڵ موشریکەکان دەرچون لەجەنگی بەدر و ڕەشای ئەوانیان زیاد بوو .

٤:- وە هەر لەو لایەنەوە لەکارو کردەوەی هاوەڵان ﵃ لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا کە لەگەل هۆزەکەی - موسەیلەمە و سجاح و طلیحة و زەکات نەدەرەکان و هاوشێوەکانیان – شەڕیان کرد لەگەڵیان بەبێ جیاوازی ، هەرچەندە ئیحتیمالی ئەوە هەبو کە هەندێکیان ڕای جیاوازیان هەبوو بێت بەڵام دەمارگیری بوە هۆی بەژدار کردنیان ، لەگەڵ ئەوەشدا هەمویان یەک مامەڵەیان لەگەڵ کرا ، کە ئەمانە بەڵگەن کە هەرکەسێک پشت گیری کافران بکات وەکو ئەوان کافرە .

**باسی پێنجەم :**

**بەڵگەکان لە پێوان ( القياس ):**

کە ئەمەش لە دوو ڕووەوەیە :

**یەکەم** : لەفەرمودەی صحیح هاتووە کە رسول الله ﷺ فەرموویەتی ﴿ من جهز غازيا فقد غزا ﴾ واتا ( هەرکەسێک موجاهیدێک ئامادە بکات ئەوە جیهادی کردووە ) ئەو کەسەی کە دانیشتووە و موجاهیدێک ئامادە دەکات وەک ئەوەی لێکرد کە لە جیهاد بەژداری ئەکات ، وە هەر لەم بارەیەوە ئەفەرمێت ﷺ : {إن الله ليدخل بالسهم الواحد ثلاثة نفرالجنة : صانعه يحتسب في صنعه الخير ، والرامي به ، ومنبّله } رواه أبو داود والنسائي و صححه الحاكم .

واتا ( الله به یەک تیر سێ کەس ئەکاتە بەهەشتەوە ، ئەوەی دروستی کردووە بەنیەتێکی خێر ، وە ئەوەی تێی دەگرێت وە ئەوەی ئەیداتە دەستی )

ئەمەش بەڵگەیە – پێوانە دەکرێت بە پێچەوانەکەی ( بالعكس ) - کە هەرکەسێک هاوکاری کافران بکات لە شەڕیان ئەوە هاوکاری کردووە لەشەڕکردن لە پێناو طاغوت .

**دووەم** :- ئەو کەسەی کارەکە ئەنجام ئەدات وە ئەوکەسەی کە پشتگیری دەکات حوکمیان وەکو یەکتر وایە لەشەرعا ، لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی ئەو کارە کە ئەکات بە هاوکاری ئەو کەسەیە کە پشت گیری ئەکات ، هەروەکو چۆن شیخ الأسلام فەرموویەتی ( ئەگەر هاتو دزە شەڕکەرەکان کۆمەڵێک بوون و یەک کەسیان کاری کوشتنی ئەنجام دا وە ئەوانەی تر پشت گیریان کرد ، وتراوە تەنها ئەو کەسە ئەکۆژرێتەوە ، بەڵام کۆڕای زانایان ( جمهور ) لەگەڵ ئەوەن کە هەمویان ئەکوژرێن ئەگەر ۱۰۰ کەسیش بن ، ئەوەی کارەکە ئەکات و ئەوەی پشت گیری ئەکات وەکو یەکن ، وە جێنشینەکانی پێغەمبەر ﷺ وایان کردووە ، ئیمامی عومەر رضي الله عنه ربیئەی شەڕکەرەکانی کوشت ( ربيئة ) ئەو کەسەیە کە لە شوێنێکی برز دانیشتووەو چاودێری دەکات تا بزانێت کێ دێت )، ئەوکەسە بۆ یە ئەتوانێت ئەوکوشتنە بکات چونکە پشت گیریری و هاوکاری ئەکرێت ، وە کۆمەڵەیێک ئەگەر یەکتری سەر بخەن تا وایان لێدێت تۆکە دەبن ، ئەوکات ئەوان هاوبەشن لە پاداشت و سزا هەروەکو موجاهیدەکان ؛ رسول الله ﷺ ئەفەرمێت { موسڵمانان خوێنیان یەکسانە هەوڵی بەجێهێنانی نزمترینیان ئەدرێت و ئەوان یەک دەستن لەسەر بەرامبەریان وە ئەوەی دەستی سریەیەک دەکەوێت دەگەڕێتەوە بۆ بنچینەکەیان }

واتا : ئەگەر سوپای موسڵمانان بەشێکیان لەلایەکە وە پارەیان بە غەنیمەت دەست کەوت ئەوا سوپاکەش لەو غەنیمەتە بەژدارن لەبەر ئەوەی بەتواناو سەرخستنی ئەوان دە ستیان کەوتووە ... ،

بۆیە ئەوکەسانەی پشتگیری کۆمەڵێک دەکەن و هاوکاری دەکەن لەوان لە هەموو شتێک ، وە ئەوانەش هەروان کەلەسەر ناهەق جەنگ دەکەن بەبێ هیچ گومانێک " .

**باسی شەشەم :**

**بەڵگەکان لە قسەو فەتوای زانایان :**

**--- قسەکانی زانایانی مەزهەبی ( حەنەفی )**

١:- أحمد علی الرازی ، أبوبکر الجصاص ( ٣٧٠ ك ) فەرمویەتي :

الله تعالی ئەفەرمێت ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾ التوبة ٢٣ واتا ( ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، باو و باپیران و براکانتان مەکەنە پشتیوان و خۆشەویستی خۆتان، ئەگەر ئەوان بێ باوەڕیان خۆش ویست و هەڵیانبژارد بەسەر ئیمان و باوەڕدا، هەرکەس لە ئێوە پشت بەوان ببەستێت و خۆشی بوێن، ئائەوانە هەر ستەمکارن. )

الله تعالی ڕێگری دەکات لەوەی بڕواداران دۆستایەتی کافران بکەن یان سەریان بخەن یان داوای ئەوەیان لێ بکەن سەریان بخەن و کاربدەنە دەستیان ، بەڵکو دەبێت تەبەڕایان لێ بکرێت و واز لە بەگەورەگرتن و ڕێزلێگرتنیان بهێنرێت ئەگەر باوکۆ براشیان بن ...، بۆیە الله تعالی ئەم فەرمانەی داوە تاوەکو جیاببنەوە لە مونافیقان ، لەبەر ئەوەی مونافیقان دۆستایەتی کافران ئەکەن وە بەئاشکرا بەگەورەیان دەزانن وە ڕێزیان لێ دەنێن کاتێک دەگەن پێیان و پشت گیرییان بۆدەردەبڕن ، بۆیە الله تعالی ئەم فەرمانەی کرد بە بڕواداران تاوەکو جیاببنەوە لە مونافیقان . [ أحكام القران ]

٢:- عبدالله بن أحمد أبو برکات النسفی ( ٧١٠ ك ) فەرمویەتی :

ئەم ئایەتە دابەزی ڕێگری کرد لە دۆستایەتی دوژمنانی دین ، الله تعالی ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ﴾ المائدة ٥١ واتا : دۆستایەتییان مەکە ن ، سەریان مەخەن ، و یان داوای سەرخستنیان لێ مە کەن یان برایەتییان مە کەن یان تێکەڵیان مە بن وەکو بڕواداران ، پاشان هۆکارەکەی دیاری کردووە ﴿ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ﴾ هەمویان دوژمنی بڕوادارانن ، ئەوەش ئەو بەڵگەیەی تێدایە کە هەموو کافران یەك میلەتن ﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ﴾ئەویش لەوانەو

حوکمی هەروەکو ئەوانە ، ئەمەش هەڕشەیەکی زۆر توندە لە الله تعالی وە کە واجبە لە دووژمنانی دین دور بکەوینەوە ، ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ الله تعالی ڕێنوێنی ئەوانە ناکات ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردو دۆستایەتی کافرانیان کرد .

٣ :- القاضی محمد بن أحمد أبو سعود العمادی ( ٩٥١ ك ) ئەفەرمێت : " ئەم ئایەتە﴿ومَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ حوکمێک دەرهێنراو لەم ئایەتە ئەوەیە ﴿ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ﴾ کاتێک لەنێوان خۆیانا دۆستایەتی یەکتر دەکەن ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوەی لەگەڵ ئەوان بێت لەوانە ، وە ڕێگرییەکی توندی تێدایە بۆ برواداران کە نابێت خۆتان وا نیشانبدەن کە دۆستیانن ئەگەر لەڕاستیشدا وا نەبێت ، ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ ڕونی دەکاتەوە ئەوەی دۆستایەتیان بکات ڕوێنوێنییان ناکات بۆ ئیمان بەڵکو وازیان لێ دەێنێت ئەوانش دەکەونە ناو کوفرو گومڕایی " . [ تفسیر القاضی أبو سعود ]

## --لە قسەو فەتواکانی زانایانی ( مالیکی )

١:- أبو عبدالله القرطبی ( ٦٧١ ك ) ئەفەرمێت : وتەی الله تعالی ﴿ ومَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ ﴾ یارمەتییان بدات لەدژی موسڵمانان ﴿ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ﴾ الله تعالی ڕونی ئەکاتەوە کە حوکمی وەکو ئەوانە ، ئەم کارە ڕێگیری دەکات لەموسڵمان کەمیراتی لە هەڵگەڕاوە ( مرتد ) بگرێت ، وە ئەم کەسەی کە دۆستایەتییانی کرد عبداللە کوڕی ئوبەی بوو، ئەم حوکمە دەمێنێت تاکو قیامەت لە پچڕاندنی خۆشەویستی و سەرختنی کافران ". [ تفسیر القرطبی ]

٢:- پرسیار کرا لە أبو عبدالله أحمد بن محمد ناسراو بە شێخ علیش ( ١٢٩٩ك ) لەسەر مانەوە لەنێوان کافران ئەگەر وڵاتی موسڵمانانیان داگیرکرد و کۆچ نەکردن لیی ،

وەڵامێکی دوردرێژی دایەوە ، بەشێک لەوەی وتی : ئەم دۆستایەتییە شیرکییە نەبووە لەسەردەمی عیززەتی ئیسلام وە ڕوی نەداوە تاوەکو سەدان ساڵ و پاش نەمانی پێشەوا و تێکۆشەرانی ئیسلام کەکەس نەیتوانی خۆی بدات لەم باسە فیقهییە گرنگانە ، بەڵکو ئەمە کاتێک سەری هەڵدا کە دۆستایەتی نەصرانییەکان ( وڵاتانی ڕۆژئاوا ) لەساڵانی ( ٥٠٠ ك ) و بەرەو دواوە کاتێک نەفرین لێکراوانی نەصرانییەکان (الله تعالی لاناویان ببات ) کەدورگەی صقلیە و بەشێک لەئەندەلوسیان داگیر کرد ".

وە کاتێک پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو حوکمانەی کە پەیوەندی هەیە بەم دۆستایەتییەوە ،

وەڵامی دایەوە و وتی : (ئەو زانایانەی کار بەزانستەکەیان ئەکەن وا ئەبینن حوکمیان وەکو ئەوانە وایە کە موسڵمان بوون و کۆچیان نەکرد – واتا لە دار الكفرماون–وە ئەوانەی پرسیار دەربارەیان کراوەو وە ئەوانەی وسکتن دراونەتە پاڵی ئەوان ، هەردو کۆمەڵەکە یەک حوکم دراوە بەسەریاندا لە ڕووی ماڵ و منداڵیان وە هیچ جیاوازییەک نابینن لە نێوانیان لەبەر ئەوەی دۆستایەتی دوژمنان و نیشتەجێبون لەگەڵیان و تێکەڵبونیان و خۆڕون نەکردنەوە لەناویان و وازهێنان لە کۆچ کە واجبە ئەمانە حوکمی کەسی وسکت لەسەری و کەسی پرسیار کراوە لەسەری یەک حوکمە ، بۆیە ئەوان ﷺ حوکمی ئەوانیان داوەتە پاڵ ئەوان .... ) . [ فتح العلى المالك ]

٣:- پرسیار کرا أبو حسن علی بن عبدالسلام التسولى المالكى ( ١٣١١ ك ) لەسەر ئەو هۆزانەی لا جەزائیر ماونەتەوەو دەرنەچون بۆ جیهاد ، وە هەواڵی موسڵمانانیان ئەدا بە فەڕەنسییەکان ، لەوەڵامدا فەرموی : " ئەو هۆزانەی باسیانتان کرد ئەبێت جەنگیان لەگەڵ بکرێت وەکو ئەو کافرانەی کە دۆستایەتییان دەکەن وە هەرکەسێک دۆستایەتی کافران بکات ئەوە لەوانە ،

الله تعالى ئەفەرمێت ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ المائدة ٥١ واتا (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان یارو یاوەرو پشتیوانی یەکترن، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی خوا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات... ) بەڵام ئەگەر مەیلیان نەبوو بۆ کافران و پشتگیرییانیان نەکرد و هەواڵی موسڵمانانیان بۆیان ئاشکرانەکرد و هیچ کارێکیان لەمانە ئاشکرا نەکرد ، تەنها دەرنەچون بۆ جیهاد ئەوکاتە شەڕیان لەگەڵ دەکرێت وەکو کۆمەڵەی باغی ( الباغية ) ئەو موسڵمانانەیکەلەسەر ناحەقن ". [ أجوبة التسولى على مسائل الأمير عبدالقادر الجزائرى ]

